# [بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ]

**ئەم بابەتە نوێ کراوەتەوە بەهەندێک دەسکاڕیەوە**
**لە بەڕێز سەعید عبدالکریم**

## پێشەکی

**سپاس و ستایش بۆ خودای زانا و باڵا دەست صەلات و سلام لەسەر گیانی پاکی پێشەوای مرۆڤایەتی محمد(ﷺ)**

**سپاس بۆ خودای باڵادست کە یارمەتی دام لەسەر نوسینی ئەم بابەتە بۆ نوسینی بابەتی(کەنیزەک لە ئیسلامدا)و دەرخستنی ئەو حیکمەت و ئامانج و مەبەستانەی کە شەریعەتی ئیسلام لەم پرۆسەیەدا هەیەتی**

**بەڕێزانی خوێنەر لەم بابەتەدا پشتیوان بەخوا وڵامی ئەم چەند خاڵە ئەدەینەوە:**

**یەکەم:دەستەبەر(التبنى)چیە؟ کەنیزەک چیە؟**

**دووەم:بە کۆیلەکردن چۆن بوە لەپێش ئیسلام**

**سێیەم:مەرجەکانی بەکەنیزەککردن چیە و کێ دەکرێتە کەنیزەک لە ئیسلامدا**

**چوارەم:مافەکانی کەنیزەک چین**

**پێنجەم:ئەو کارانەی کە حەرامن لەبابەتی کەنیزەکدا چین**

**شەشەم:بە کەنیزەککردن یان ئێهمالکردن**

# بابزانین کەنیزەک چیەو بۆچی دوژمنانی ئیسلام زۆر باسی دەکەن و ڕەخنەی لێدەگرن

## یەکەم:دەستبەسەر چیە؟ کەنیزەک چیە

دەستبەسەر بریتین لەدەسگیرکراوانی شەڕی نێوان مسولمانو کافران دا وشەیەکە زیاتر بۆ ئافرەتو منال بەکار هاتوە لەزمانی عەرەبیدا چونکە زیاتر ئەو دوو چینە لەشەڕدا دەستبەسەر ئەکرێن و بەگشتی پیاوان دەکوژرێن یان هەڵدێن لەشەڕدا

## دووەم:پێش ئێسلام کۆیلە چۆن بو؟

پێش ئیسلام بەکەنێزەک کردن نەبوە بەلکو

کۆیلەکردن هەبوە کە چەوسانەیەکی بێ وێنەو تاڵ و خراپ و قێزەون بو  هەر ئافرەتەتێک لەشەڕدادەسگیربکرایە ڕاستەوخۆ دەکوژرا یاخود دەکرا بەکۆیلەو بەندە لێرەدا زۆر گرنگە بزانین بەکۆیلەکردن و بەکەنیزەک کردن زۆر جیاوازن لەگەل یەکتر چونکە کۆیلە هیچ مافێکی نیەو گەورەکەی ئەتوانێت هەمو کارێکی شیاو نەشیاویان پێبکات و هەمو جۆرە

سوکایەتیەکیان پێکردوە و هیچ دەوڵەت و گروپێکیش نەبون ببنە خەمخۆر و وەلی ئەمر و سەرپەرشتی بۆ ئەوەی ئەو هەرجۆرە مافێکی بۆ دابین بکەن ئەوەی بەکۆیلەکردن و کۆیلایەتی بخوێنێتەوە لەبەر تەوژمی ئیلحاد و کوفرو شیرک و بتپەرسە و خاچپەرست و ئاگر پەرست تەنانەت بەناو فەلسەفیەکان و دایانی یۆنانی و هاوشێوەکانیان بێزی لەمڕۆڤ و مڕۆڤایەتی دەبێتەوە و مەیلی ئەوە دەکات پڕبەگەروی هاواربکات لەتاو ئەوەی بەسەر مڕۆڤایەتی و ئافرەت بەتایبەتیدا هێناویانە

## وە هەندێک لەو هۆکارانانە بریتین لە:

**1)بەهۆکاری جەنگ لەنێوان گەل و هۆز و ئیمبراتۆرەکان**

**2)نزمی ئاستی چینایەتی**

**3)قەرزو بێ پارەی لەبەرامبەر کردن بە کۆیلە**

**4)کرین و فرۆشتنی منداڵ بەهۆکاری هەژاری کاتێک گەورە دەبو دەکرا بەکۆیلە**

**5)خۆ فرۆشتن و هەڵبژاردنی کۆیلایەتی لەپێناو مانەوە لەژیان**

6)بەهۆكاری فڕاندن و تالانكردن بەتایبەت فڕاندنی منداڵ و هەرزەكار

7)لەدایک بون لەدایكو باوكێكی كۆیلە

ئەمانە هەندێک هۆكارن بۆ كۆیلایەتی كردن و وەكو ئاژەڵ یان كەرستە سەیریان دەكردن و بەخراپترین شێواز ڕەفتاریان لەگەڵە كردن

بەلام لەئیسلامدا بەكۆیلەكردنی خەلكی حەرامە(بەتێگەشتنی جاهیلی بۆ كۆیلەو بەو شێوازی ئەوان)بەلكو ژنانی ئەهلی كتاب كەدەسگیر ئەكرێن دەتوانرێت بكڕێنە كەنیزەک كەئەویش جۆڕێكە لەهاوسەرگیری و دەولەت دەبێتە وەلی ئەمری ئافرەتەكە و مافەڕەوایەكانی بەپێی شەریعەتی ئیسلام بۆدەستەبەر دەكاتو چاودێری ژیان و گوزەرانی دەكات

## كەنیزەک(ملک الیمین)

*لەڕووی زمانەوانەیەوە:واتە(ئافرەتانی ژێردەستەكراو یان دەستگیركراو)

*لەڕوی زاراوەی بەکارهێنان:(اصطلاح)ئەو ئافرەتانەن کە لەشەری نێوان مسولمانو کافران دەستگیر دەکرێن و ڕاسپاردەی پیاوێکی مسولمان دەکرێن بەپێی ڕێوشوێنی شەرعی وەک ئاشکرایە لەئیسلامدا بەگشتی دروستنیە لەشەردا(پیاوی پیر، ژن، منال، ئاژەل)بکوژرێن و نابێ(دار ودرەخت) ببڕدرێنەوە باهی کافرو نامسولمانانیش بن لە ئیسلامدا ئەو ئافرەتانەی لەناو سوپای بێباوەڕاندان بەلام ڕاستەوخۆ شەڕ ناکەن

ئەوا دوای دەسگیرکردنیان ناکوژرێن بەلکو

ڕاسپاردە ئەکرێن ئەمەش ئایەتی قورئان و کۆدەنگی زانایانی لەسەرە کەلە خوارەوە دەخەینە رو:

*خودا دەفەرمێت(يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ)[الحجرات13]

واتە: خوا کردوونی بە چەند گەل و هۆزێك بۆ ناسینی یەکتر ئەی خەڵکینە! بێگومان ئێوەمان لەپیاوو ژنێك دروستکردووە، واتە: لە ئادەم و حەوا، جا ئیتر ئەم هەموو سووکایەتیە چیە بەیەکتری ئەکەن؟ بۆچی ئەگەر

(بیلال) بۆ سەربانی کەعبە سەرکەوێ ئێوە پێتان ناخۆشە، هەر لەبەر ئەوە کە کاتی خۆی کۆیلە بووە؟

کردوومانن بەچەند گەل و تیرەیەك تا یەکتری بناسن، نەك بۆ گاڵتە کردن و تانەو تەشەردان لەیەکترو ستەم لەیەکتر کردن بێگومان بەرێزتریشتان لای خوا، ئەوەتانە کە بەتەقوا ترو خۆ پارێزتر بێت، وە لەسنوورەکانی خوا نەترازێت بەڕاستی خوا بەبەندەکانی خۆی زانایە، بەدڵ و دەروونیان بەئاگایە.

*وە خودا لەشوێنێکیتر ئەفەرمێ(يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ خُذُواْ حِذْرَكُمْ فَٱنفِرُواْ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُواْ جَمِيعًا)[ النساء70]

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! دەبێ هەمووکات وریابن و هۆشی خۆتانتان هەبێ و ئامادە بن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنانی دینی خوا دەسا دەستە دەستە، تیپ تیپ، بچنە جیهاد وە یان هەمووتان پێکەوە بچنە غەزاو هەڵمەت بەرن بەپێی پێویست، مەبەست ئەوەیە کەهیچ کات گۆڕەپان چۆڵ نەبێ، ئەگینا موسڵمانان سوك و ریسوا ئەبن

*وەهەروەها لەشوێنێکیتر دەفەرمێ

[وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا]

{الإنسان8} واتە: هەروەها نان و خۆراك دەبەخشن، ئەگەرچی خۆشەویستیش بێت لایان، بەهەژارو هەتیوو دیلەکان

(ابن عەباس){رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ}ئەفەرمووێ: لەو ڕۆژگارەدا دیلی موسڵمان نەبووەو دیلی موشریکان بووە، واتە: خوای گەورە مەدحی ئەو کەسانە ئەکات کە خواردن بەمانە ئەدەن، وە خواردن بە دیلی کافرانیش ئەدەن، هەروەکو لە غەزای بەدر پێغەمبەر{ﷺ}فەرمانی کرد بە هاوەڵان کە چاکە لەگەڵ دیلە کافرەکاندا بکەن ئەوانیش لە خواردندا پێش خۆیان دەخستن

*هەروەها لە غەزای بەدردا پیاوێکی ئەنصاری (ئیمامی عەبباسی){رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ} بە دیل گرت و ئەنصاریەکان وتیان ئەیکوژین ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەر{ﷺ} فەرمووی: ئەمشەو لەبەر (عەبباس){رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ}ی مامم خەوم لێنەکەوتووە چونکە ئەنصارییەکان دەڵێن دەیکوژین، (ئیمامی

عومەر){رَضِيَ اللهُ عَنْهُ} فەرمووی: بڕۆم بۆ لای ئەنصارییەکان فەرمووی بەڵێ، چوو بۆ لایان و پێی فەرموون: (عەبباس){رَضِيَ اللهُ عَنْهُ} ئازاد بکەن، وتیان نا سوێند بە خوا ئازادی ناکەین، فەرمووی: ئەی ئەگەر پێغەمبەر{ﷺ} بەم شتە رازی بێت؟ وتیان ئەگەر پێغەمبەر{ﷺ} رازییە بیبە، (ئیمامی عومەر) (ئیمامی عەبباس){رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}ی هێناو پێی فەرموو: (ئەی عەبباس) موسڵمان بە سوێند بە خوا ئەگەر تۆ موسڵمان بیت لە لام خۆشترە لەوەی کە (خطاب)ی باوکم موسڵمان بێت، چونکە دەزانم پێغەمبەر{ﷺ} پێی خۆشە تۆ موسڵمان بیت، پاشان پێغەمبەر{ﷺ} راوێژی بە (ئیمامی ئەبو بەکر){رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}کرد سەبارەت بە دیلەکان، (ئیمامی ئەبو بەکر) {رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}

فەرمووی: هۆزو عەشیرەتی خۆتن ئازادیان بکە، وە راوێژی بە (ئیمامی عومەر) کرد، (ئیمامی عومەر) فەرمووی: بیانکوژە، پێغەمبەر{ﷺ} ئازادی کردن بە بەرامبەر، خوای گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند:(مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنْيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ)

{الانفال67}

واتە: بۆ هیچ پێغەمبەرێک نەبووە کە دیلی هەبێت، هەتا کاتێک چاک پایەدارو جێگیر دەبێت لە زەویدا مەگەر کەلوپەل و شتومەکی دنیاتان دەوێت لەکاتێکدا خوا سەرفرازیی ئەو جیهانی دەوێت و قیامەتی مەبەستە و خوا باڵادەست و دانایە (سەرکەوتن بەئیمانداران دەبەخشێت و دانایە لە تاقی کردنەوەیاندا)

پاشان پێغەمبەر{ﷺ}گەیشت بە (ئیمامی عومەر) {رَضِيَ اللهُ عَنْهُ} پێی فەرموو: نزیك بوو بە هۆی وەرنەگرتنی بۆچوونی تۆوە توشی بەڵا بین

## *فەرمان و ڕێنمایەکانی خۆشەویستمان محمد(ﷺ) لە جەنگدا:

1)منداڵان مەکوژن

2)بەتە مەنەکان مەکوژن

3) ئافرەتان مەکوژن

4) خەڵکی نە خۆش ولاواز مەکوژن

5)پیاوانی ئاینی وقشە وکاهینە کان مەکوژن

6)تەرمی مردوو مەشێوێنن

7)پەرەستگاو کڵێساو شوێنە ئاینیەکان مەڕوخێنن

8)گیانە وەرێک مەکوژن مەگەر بۆخواردن بێت

9)کۆشک وتەلارەکان خاپور مەکەن

10)ئەو کەسانە مەکوژن کە خۆدەدەن بە دەستەوەو شەڕکەر نین

11)ڕەفتار جوان بن لە گەڵ بەند کراو سجن و ئەسیرە کان

12)کەسی ڕاکردوو مە کوژن

13. ئیسلام مەسەپێنن بە سەر کەسێک کە موسڵمان نیە

14.دار مە بڕنە وە

15.بیرو چاڵاو پڕ مەکەنەوەو هەندێک

* (ئەبوو هورەیرە){رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ} ئەفەرمێ:
پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (تعلموا من أنسابكم ما تصلون به أرحامكم )[ تيرمزيی: كتاب البر: 150/8]
واتە: ئەوەندە کە خزمانی خۆتانی پێ بناسن، ڕشتەو

نەژادو نەسەبی خۆتان بزانن، واتە بزانن لەهۆزو خێڵی کێن تا سەردانی یەکتر بکەن و بەدەم کێشەکانیانەوە ببن

*ابن حزم(رەحمەتی خوای لێبێت)دەفەرمێ:

(واتفقوا انه لا يحل قتل صبيانهم ولا نسائهم الذين لا يقاتلون){مراتب الاجماع-ص201}

واتە:زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کوشتنی

ئەو مندڵو ژنە بێباوەڕانەی کە(راستەوخۆ)شەڕ ناکەن حەلاڵ نیە

*ئیمامی النووی(ڕەحمەتی خوای لێبێت)

دەفەڕموێت:(اجمع العلماء على عمل بهذا الحديث[نهى رسول الله(ﷺ)عن قتل النيساء

و الصبيان]و تحريم قتل النساء وصيبان اذا لم

يقاتلوا){شرح صحيح مسلم-ج12-ص36}

واتە:زانایان کۆدەنگن لەسەر کارکردن بەم فەرمودەیەی کە پێغەمبەر(ﷺ)نەهی کردوە لە کوشتنی منداڵ و ژن و حەرامی دەکەن

**ئەگەر ڕاستەوخۆ شەڕ نەکەن**

## کەواتە ژنانی دەسگیرکراو لەجەنگدا حوکمیان چی دەبێت؟

**ئەو ئەمیرو خەلیفەی مسولمانان بڕیار دەدات لەسەر چارەنوسی ئەو دەسگیرکراوانە بە یەکێک لەوڕێگایانەی کە شەریعەتی ئیسلام دایناوە ئەوانیش:**

**1)یان بێبەرامبەر ئازد ئەکرێن**

**2)یان بەفیدیە ئازاد ئەکرێن(بەپارە یاخود دیل بەدیل)**

**3)یان ئەکرێن بەکەنیزەک**

**خوای گەورە ئەفەرمێت:**

**[فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا]**

**{محمد4} واتە: دوای کۆتایی هاتنی جەنگ و کوشتار ئەتوانن بەبێ بەرامبەر دیلەکان ئازاد بکەن یاخود بەبەرامبەر ئازادیان بکەن تا جەنگ کۆتایی دێت لەگەڵ کافراندا، یاخود تا چەکەکانیان فڕێ ئەدەن و تێکئەشکێن، یاخود تا شەریك دانان بۆ خوا نامێنێت**

## کێ چارەنوسی ئەم دەستگیرکراوانە دیاری ئەکات؟

دەبێت خەلیفەی مسوڵمانان چارەنوسی ئافرەتە دەستگیرکراوەکا بەیەکێک لەم ڕێگایانە یەکلایی بکاتەوە(بێبەرامبەر ئازاد کردن__بە فیدیە ئازادکردن__بە کەنیزەککردن)ئەم بڕیارەش خەلیفەی مسوڵمانان نابێت لەخۆیەوە بیدات بەڵکو سەیری بارودۆخی ئەوکاتە دەکات و کامەی مەسلەحەتی مسوڵمانانی تێدابو پێویستە ئەوەیان بکات وەک خودا لەقورئان ئەفەرمێ[وَأَنكِحُواْ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ۚ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ]{النور32}

واتە:ژن بدەن بە پیاوانی بێ ژن و ئافرەتانی بێوەژن بدەن بەشوو، هەروەها ژن بدەن بە بەندە صاڵحەکانتان و کەنیزەکە کانیشتان بدەن بە شوو ئەگەر هەژاریش

بن، ئەوە خوا لە فەزڵ و بەخششی خۆی بەهرەوەریان دەکات، خوای گەورەش هەمیشە فراوانگیرو زانایە.

چەندین نمونەمان هەیە لەمێژودا کە خەلیفەکانی مسوڵمانان ئافرەتانی دەستگیرکراوی جەنگیان نەکردوە بە کەنیزەک و ئازادیان کردون بێ بەرامبەر وەکو(صلاح الدين ئەيوبی)لەجەنگی دژی خاچ پەرستان دا ئافرەتانی دەستگیرکراوی بێ بەرامبەر ئازاد کرد و نەیکردن بە کەنیزەک

واتە مەرج نیە هەموکات ئافرەتانی دەستگیرکراو بکرێنە کەنیزەک بەڵکو بەپێی بارودۆخی ئەوکاتەی مسوڵمانان خەلیفەی مسوڵمانان ئەم بڕیارە دەدات و ڕەچاوی مەسلەحەتی گشتی دەکات

## ئایە هەمو ئافرەتێکی نامسوڵمان دەکرێت بەکەنیزەک؟

خودا دەفەرمێت[وَلَا تَنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ۚ وَلَأَمَةٌ مُّؤْمِنَةٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكَةٍ وَلَوْ أَعْجَبَتْكُمْ ۗ وَلَا تُنكِحُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤْمِنُواْ ۚ وَلَعَبْدٌ مُّؤْمِنٌ خَيْرٌ مِّن مُّشْرِكٍ وَلَوْ

أَعْجَبَكُمْ ۗ أُوْلَـٰٓئِكَ يَدْعُونَ إِلَى ٱلنَّارِ ۖ وَٱللَّهُ يَدْعُوٓاْ إِلَى ٱلْجَنَّةِ وَٱلْمَغْفِرَةِ بِإِذْنِهِۦ ۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ]{البقرة221}

واته:ئافرەتانی موشریک و خواناس مارە مەکەن هەتا ئیمان و باوەڕ دەهێنن، بێگومان کەنیزەکێکی ئیماندار چاکترە لە ئافرەتێکی موشریک و خوانەناس، هەرچەندە (جوانییەکەی، یان سامانەکەی، یان پلەو پایەکەی) سەرسامی کردبن و ژن مارە مەبڕن لە پیاوانی موشریک و خوانەناس هەتا ئیمان و باوەڕ دەهێنن و بەڕاستی بەندەیەکی ئیماندار چاکترە لە موشریک و خوانەناسێک، هەرچەندە سەرسامی کردبن (قەدو قیافەو پلەوپایەو سامانەکەی)، ئائەو خوانەناسانە بانگەوازی مەردوم دەکەن بەرەو دۆزەخ، خوایش بانگهێشتی مەردومان دەکات بەرەو بەهەشت و لێخۆشبوون بە فەرمان و ئیزنی خۆی (کە گوێڕایەڵی ڕێبازەکەیەتی) و خوا ئایەتەکانی

(قورئانەکەی) بەروونی دەخاتە بەرچاو بۆ خەڵکی، بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرن و تێبگەن.

زانایان دوو ڕای جیاوازیان هەیە:

1)ابن عبدالبر دەفەرموێت:جمهوری زانایان(لەوانە ئیمامی شافعی و مالیک و احمد)لەسەر ئەوەن کە تەنها ئەو ئافرەتە دەسگیرکراوانە بەحەڵال دەزانن بکرێنە کەنیزەک کە ئەهلی کتابن(واتە مەسیحی یان جولەکەن{الأستذکار-ج16-ص265}

*ئیمامی النووی(رەحمەتی خوای لێبێت)

دەفەرمێت:[واعلم ان مذهب الشافعي ومن قال بقوله من العلماء ان المسبية من عبدة الأوثان و غيرهم من الكفار الذين لا كتاب لهم لا يحل وطؤها بملک اليمين حتى تسلم فمادامت على دينها فهي محرم]{شرح صحيح مسلم - ج10-ص31}واتە:بزانە کەمەزهەبی شافعی و هەمو ئەو زانایانەی لەسەر ئەو مەزهەبەن لەسەر ئەوەن کە ئەو ئافرەتە دەسگیرکراوانە ئەگەر بت پەرست بن یان بێ باوەڕبن و ئەهلی کتاب نەبن سەرجێی کردن لەگەڵیان دروست نیە هەتا مسوڵمان دەبن وە هەتاوەکو لەسەر دینەکەی خۆیان(بێباوەڕیەکەیان)بمێننەوەحەرامە سەرجێیان لەگەڵ بکرێت

*پسیار کرا لە ئیمامی مالک(رەحمەتی خوای لێبێت)ئایا دروستە سەرجێی کردن لەگەڵ کەنیزەکدا کە ئەهلی کتاب نەبێت

فەرموی:نەخێر هەتا پاک نەبێتەوە لەسوڕی مانگانە و مسوڵمان نەبێت{المدونە2/220}

* ابن حزم(رەحمەتی خوای لێبێت)

دەفەرموێت:دروستە ئینسانی مسوڵمان هاوسەرگیری لەگەڵ ئەهلی کتاب لە مەسیحی و جولەکە و مەسیحیەکان بکات وە دروست نیە سەرجێی لەگەل کەنیزەکێکی نامسوڵمان(جگە لە ئەهلی کتاب)بکات چونکە زەواج لەگەڵیان دروست نیە

2)بەشێکی تر لەزانایان

وەکو(ابنقدامە__الصنعانی__الشوکانی)ڕایان وایە کە دروستە هەمو ئافرەتێکی نامسوڵمان بکرێتە کەنیزەک بەلام دروست نیە بە زەواجی نیکاح

ئەو کەنیزەکانە مارە بکەن کە ئەهلی کتاب نین(واتە دروست نیە بەلایانەوە کەنیزەکی غەیری ئەهلی کتاب

**بکەنە هاوسەرگیری هەمیشەیان)بۆ ئەم بابەتە دەتوانیت سەیری کتێبی{جامع احکام النساء_ج4_ص650}بکەیت**

## سێیەم:مەرجەکانی بەکەنیزەککردن چین لەئیسلامدا؟

**1)پێویستە ئەو ئافرەتە لەڕیزی سوپای بێباوەڕاندابوبێت و بەشداری شەڕەکەی کردبێت**

**2)پێویستە ئەو ئافرەتە ئەهلی کتاب بێت**

**(واتە مەسیحی یان جولەکە بێت)جگە لەو دوانە ناتوانرێت بکرێتە کەنیزەک(ئەمە لەسەر ڕای ئەو زانایانەی پێیان حەرام بوە جگەلە ئەهلی کتاب بکرێنە کەنیزەک)**

**3)پێویستە هەر پیاوێکی مسولمان بەپێی گرێبەستێک(کەلەنیوان دەوڵەت وپیاوەمسوڵمانەکەدا دەبەسرێت)ئافرەتەکە بکاتە کەنیزەکی خۆی کە دوایش دەوڵەت چاودێری پیاوەکە دەکات لە چۆنیەتی هەلسوکەوتکردن لەگەل ئافرەتەکەدا گەر پیاوەکە**

بەشێوەکی نامرۆڤانە هەلسوکەوتی کرد لەگەل کەنیزەکەکە ئەوا دەوڵەت ئافرەتەکەی لێدەستێنێتەوە

هەر پیاوێک بەبێ هەبوونی ئەم گرێبەستە سەرجێی لەگەڵ ئافرەتێکی دەسگیرکراودا بکات حەددی زینای لەسەر جێبەجێ دەکرێت

ئیمامی شافعی(رحمه الله)دەفەرموێت:[واذا اعتصب الرجل الجارية ثم بعد الغصب وهو من غير اهل الجهالة اخذت منه الجارية والعقر واقيم عليه حد الزنا]{كتاب الأم_ج3_ص253} واتە:ئەگەر پیاوێکی مسوڵمان سەرجێی لەگەل کەنیزەکێک کرد (بەبێ بەستنی هیچ گرێبەستێک) ئەوە کەنیزەکەکەی لێ دەسەنرێتەوە و حەددی زیناشی لەسەر جێبەجێ دەکرێت جگە لە پیاوێک کە بەم حوکمەی نەزانیبێت وعیلمی نەبوبێت دەربارەی

لەخالی دوەمدا زانیمان کۆیلە هیچ مافێکی نەبوە لای نامسولمان وکافرەکان  ئەی کەنیزەک لەئیسلامدا چ مافێکی بۆدابین کراوە؟

**چوارەم:مافەکانی کەنیزەک چین لەئیسلامدا**

1)دەبێت ئەو پیاوە شوێنی نیشتەجێبونی دیاری بکات

2)دەبێت لەهەمان ئەو جل و بەرگەی بۆبکات کەبۆ ماڵو مندالەکەی دەکات

3)دەبێت لەهەمان جۆری خواردنی بداتێ کە پیاوەکە بۆخۆی و ماڵ و مناڵەکەی دەخوات

4)نابێت ئیشێکیان پێبسپێرێت کەلەتوانایدا نەبێە بەلگەمان بۆ ئەو قسەیە چیە؟

بەلگەمان ئەو فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرمێ:

[هم اخوانكم جعلهم الله تحت ايديكم فاطعموهم مما تاكلون والبسوهم مما تلبسون ولا تكلفوهم ما يغلبهم فان كلفتموهم فاعيونهم]

{البخاری6050و مسلم1661}

واتە:ئەوانە خوشکو براتانن خوای گەورە خستونیەتە ژێر دەسەلاتی ئێوە لەو خواردنەیان بدەنێ کەدەیخۆن لەو پۆشاکەیان بدەنێ کەخۆتان ئەیپۆشن ئیشێکیان پێمەسپێرن کە لە توانایان دانیە گەر ئیشێکیشتان پێسپارد یارمەتیان بدەن

5)نابێت بەهیچ شێوەک سوکایەتی پێبکرێت تەنانەت بۆی نیە پێی بلێ(عەبدەکەم)

6)لەمێردە کۆنەکەی چەند مندالی بۆ جێمابێ دەبێت ئەم پیاوە هەموی بەخێوکات نابێت بەهیچ شێوەک مندالەکان لەدایکیان جیا بکەنەوە

7)کاتێک ئەم کەنیزەکە مندالّی ئەبێت لەم پیاوە ئەوە ئەبێتە خێزانی هەمیشەیی ئەم پیاوە بەمردنی ئەم پیاوکەش ئەو ژنە دەبێتە کەسێکی ئازاد(تەنانەت ئەگەر مندالّەکەی لەباریش بچێت یان بۆ ماوەکی کەم بژی)

8)ئەو مندالّەی لەو پرۆسەیەدا دروست ئەبێت کەسێکی تەواو ئازادە و هەموو مافێکی هەیە وەک هاولّاتیەکی پلە یەک لەو ولاتە

تەنانەت لە مێژوی ئیسلامدا منداڵی کەنیزەک

بۆتە خەلیفەی مسولمانان وەکو خەلیفە(معتصم بالله)کە دایکی کەنیزەک بوە و ناوی(ماردة)بوە

9)نابێت بەهیچ شێوەک زۆری لێبکرێت بۆ گۆڕینی ئاینەکەی هەروەک خودا لەقورئان ئەفەرمێ

[وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ ..]{الكهف29}

واتە: حەق هەر ئەوەیە کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان ڕەوانەکراوە، جا ئەوەی دەیەوێت با باوەڕ بهێنێت و ئەوەی دەیەوێت با کافرو بێ باوەڕ بێت،

وە هەروەها دەفەرمێت[إِنَّا هَدَيْنَـٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا]{ الإنسان3}

واتە:بەڕاستی ئێمە ڕێنموویيمان کرد بۆ ڕێگەی ڕاست، بە ئازادی دەتوانێت ببێتە کەسایەتیەکی ئیماندارو سوپاسگوزار، یان بێ باوەڕو خوانەناس.

وە هەروەها دەفەرمێت[لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَىِّ ۚ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّـٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ]{البقرة256}

واتە:بەهیچ جۆرێک زۆر کردن نیە لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا (دینداری بەزۆر نابێت بکرێت و دین بەزۆر نادرێت بەسەر کەسدا)، چونکە بەڕاستی ڕێبازی چاک و دروست؛ ڕوون و ئاشکرا بووە و جیابۆتەوە لە گومڕایی و سەرکەشی، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە ـ تاغوت ـ (کە بریتیە لە: هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو لادان و بتێک)و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بەخوا، جا بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە، کە هیچ پسان و هەڵوەشاندنەوەیەکی بۆ نی یە و هەمیشە پتەو و دامەزراوە، خوای گەورەش بیسەرو زانایە.

وەهەروەها دەفەرمێ[لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ]{الكافرون6}

واتە:دینی خۆتان بۆ خۆتان و دینی خۆم بۆ خۆم.

10)ئەگەر پیاوێک لەکەنیزەکەی بدات سونەت وایە ئازادی بکات وەکو کەفارەتێک بۆ ئەو تاوانەی کردویەتی وەک چۆن پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی:

[من لطم مملوكه او ضربه فكفارته ان يعتقه]

{رواه مسلم 1657} واتە:هەر کەسێک لەژێردەستەکەی بدات کەفارەتەکەی ئەوەیە ئازادی بکات

11)ئەگەر ئەم ئافرەتە ڕازی نەبو بەم کەنیزەک بونە ئەوا مافی ئەوەی هەیە کەخۆی ئازاد بکات لەبەرامبەر فیدیەیەکدا(جا فیدیەکە پارەبێت یاخود ئیشکردن بێت بۆ خاوەنەکەی)بۆ ماوەیەک و بەو بڕەی کە ڕێک دەکەون لەسەری ئەمەش لەقورئاندا

بە(الکتابە_گێبەستی ئازادبوون)ناسراوە و قورئان و مسوڵمانان هەڵناوە کە ئەگەر ژێردەستەکانیان داوای گرێبەستی ئازادبونی کرد ئەوە با گرێبەستیان بۆبنوسن تەنانەت پیاوانی مسوڵمانیش هەڵدەنێ کە پارە بدەنە کەنیزەکەکان بۆ ئەوەی بتوانن خۆیانی پێ ڕزگار بکەن هەروەک چۆن خودا لەقورئان ئەفەرمێ: [ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَـٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا وَآتُوهُمْ مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ]

{النور33}واتە: ئەو کەسانەیشی کە کۆیلەن وە گەورەکانیان داوای بڕێك پارەیان لێ دەکەن بۆ ئەوەی کە لە دوای ئەوە ئازادیان بکەن ئەگەر خێرو راستگۆیی و ئەمانەت و توانای کاسپی و پیشەتان تیایاندا بینی ئەوە (موکاتەبەیان) بکەن، واتە: بەڵێننامەی ئازاد کردنیان لەگەڵدا واژوو بکەن و دوای ئەوە ئازادیان بکە وە لەو ماڵەی خوای گەورە پێی بەخشیوون ئێوە

یارمەتیان بدەن بۆ ئازاد کردنی خۆیان و لە بەشێکی خۆش ببن، یان زەکاتیان پێ بدەن بۆ ئازاد کردنی خۆیان

تێبینی: تاکە مافێک کە کەنیزەک نیەتی لەکاتی دانی بەپیاوێک مافی هەلبژاردنی ئەو پیاوەیە بەدڵی خۆی چونکە ئەم ئافرەتە لەشەڕدا دەسگیر کراوە

## پێنجەم:ئەو کارانەی کە حەرامن لەبابەتی کەنیزەک ئەنجام بدرێن چین؟

1)نابێت دوو خوشکی کەنیزەک بدرێن بەهەمان پیاو واتە پیاوێک ناتوانێت دوو خوشک بکاتە کەنیزەک لای خۆی یاخود دایکو کچ.....هتد کە ئەمەش هەمان ماف و یاسای کچان و ئافرەتانی مسولمانە بەشێکە لە دادپەروەری ئیسلام کە هەندێ ئاسای ئازادەکانی ئیمانداران ئەم کەنیزەکانە دەگرێتەوە ئەگەرچی مسولمانیش نەبن

**2)نابێت پیاوە مسولمانەکە سەرجێی لەگەڵ بکات هەتا یەک جار سوڕی مانگانەی تەواو**

**نەبێت و پاک نەبێتەوە بۆ ئەوەی بزانرێت**

**ئایا پێش ئەوەی ببێت بە ژنی ئەم پیاوە مسوڵمانە منداڵی لەسکدا نەبوە لەمێردی پێشوتری ئەگەر دەرکەوت منداڵی هەیە پێویستە ئازاد بکرێت هەتا منداڵەکەی دەبێت(منداڵەکەی کەسێکی ئازاد و هاوڵاتیەکی پلە یەک دەبێت لەدەوڵەتە ئیسلامیەکەدا و مافی بەخێوکردنی ئەکەوێتە سەر ئەو پیاوەی کە**

**ئافرەتەکە لە ئەستۆ ئەگرێت)**

**پێغەمبەر( ﷺ )ئەفەرموێت[لاتوطأ حامل حتى تضع،ولا غير حامل حتى تحيض حيضة]{رواه احمد}**

**واتە:پیاو نابێت بچێتە لای ژنێک(ژنێک بهێنێت)کە سک پڕ بێت هەتا سکەکەی دانەنێت وە نابێت بچێتە لای ژنێک کە لە سوڕی مانگانەدابێت هەتا سوڕەکەی تەواو نەبێت**

**3)دروست نیە بەهیچ شێوەک کاری نەشیاو بەو ئافرەتە بکرێت بەڵکو شەرەف و نامووس و**

کەسایەتیان بپارێزرێ کە هەر ئەمەشە ئامانجی ئەم پڕۆسەیە خوای گەورە ئەفەرمێت[ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ](النور 33) واتە:کەنیزەکەکانتان هەڵمەنێن لەسەر خراپەکاری و بۆ کاری خراپ بەکاریان مەهێنن

وە هەروەها دەفەرمێت[ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ وَإِيتَآئِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْىِ ۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ]{النحل90}

واتە:بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بە خزمان و قەدەغە لە گوناهو تاوان و دەستدرێژی دەکات (بۆ سەر ماڵ و نەفس و ناموس) و ئامۆژگاریتان دەکات بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرن و تێفکرن و (هەر چاکە بکەن).

هەروەها دەفەرمێت[وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَـٰتِ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُم مِّن فَتَيَـٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتِ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَـٰنِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ مُحْصَنَـٰتٍ غَيْرَ مُسَـٰفِحَـٰتٍ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ ۚ فَإِذَآ أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَـٰحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَـٰتِ مِنَ

ٱلْعَذَابِ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْ ۚ وَأَن تَصْبِرُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ]{النساء25}

ئواته:ئەوەش کە نەیتوانی لە ئێوە لەبەر دەست کورتی، ئافرەتانی سەربەستی باوەڕدا مارە بکات، ئەوە با لە کچەکەنیزەکە ئیمانداراەکانتان بخوازێت، خوایش زانایە کە ڕادەی ئیمانتان چەندە و چۆنە، ئێوە هەندێکتان لە هەندێکتانن (هەمووتان لە ئادەم و حەوان و ئەم جیاوازیە چینایەتیە شتێکی کاتی یە)، لەبەرئەوە ئەو کەنیزەکانە مارە بکەن لەسەر ڕەزامەندی کەس و کارو خاوەنەکانیان و مارەییان بەچاکی پێ بدەن، لەکاتێکدا ئەو کەنیزەکانەش پێویستە پاک داوێن بن و دووربن لە داوێن پیسی و دۆست گرتنەوە، خۆ ئەگەر شوویان کردو لەوەودوا داوێن پیسیەکانیان ئەنجامدا ئەوە نیوەی سزای ئافرەتانی سەربەست دەدرێن (چونکە ئازادیی تەواویان نەبووە لەو سەردەمەدا)، لەبەر ئەوە مارەکردنیان بۆ ئەوانەتانە کە دەترسێت تووشی هەڵەو گوناهـ ببێت، خۆڕاگریتان (تا خوا دەرووتان لێدەکاتەوە) چاکترە بۆتان، خوایش لێخۆشبوو میهرەبانە.

## شەشەم: بەکەنیزەک کردن یان ئێهمالکردن

گرینگترین خاڵ لەم بابەتەدا ئەم خاڵەیە چونکە هۆکاری سەرەکی هەڵەتێگەشتنی مولحید و عەلمانیەکانە بۆ ئەم بابەتە ئەوان وادەزانن بەکەنیزەک کردن بۆ کۆیلەکردنی ژنانە و تاکە ئامانج لێی زەلیل کردنی ژنانە و بەکارهێنانیانە وەکو ئامێرێکی سێکسی و تەنا بۆ چێژ وەرگرتنیانە وە هەمیشە بەجۆرێک باسی کەنیزەک ئەکەن کە ئافرەتێکە زنجیر کراوەتە گەردنی و سوکایەتی پێدەکرێت و لە ماڵێکدایە خزمەتی کۆمەڵێک پیاوی شەهوەتباز و داوێن پیس ئەکات (کە ئەم تێروانینەی خۆیان بۆ بابەتەکە کردوە بەچەند فیلم و دراما و شانۆیەک هەر پۆسێکیش ئەکەن لەتۆڕەکۆمەلاتیەکان وێنەیەکی ئەم فیلمانە بەکار دێنن کە کۆمەلێک ئافرەت بە زنجیر بەستراونەتەوە و لەبازاڕدا مسوڵمانان کرین و فرۆشتنیان پێوەدەکەن و پیاوە شەهوەتبازەکان داوێن پیسیان پێوە دەکەن بۆ چەواشەکردنی خەڵکی و ناشرین پیشاندانی بابەتەکە)

وەک چۆن لای ڕۆژئاواییە هاوبیرەکانیان ئافرەت لە مەلهاو دیسکۆکان بەکار دەهێنرێت بۆ ئەم کارە و تا ئیستا هیچ مولحیدێک لەسەر مافی ئەو ژنانەی لە دیسکۆکانی ئەوروپا ڕۆژانە دەستدرێژی و سوکایەتیان پێدەکرێت پۆستێکی نەکردوەو لایڤێکی نەکردۆتەوە هەڵوێستێکی نەنواندوە

بەلام ئامادەیە هەمو شەوێک پۆست بکات

یاخود لایڤ بکاتەوە دەیان و سەدان دڕۆ بکات و مێژوو بشێوێنێت و خەلکی چەواشە بکات لەسەر ئەم بابەتی کەنیزەکە لە ئیسلامدا ئەو تێگەشتنەی مولحیدەکان هەیانە بۆ پڕۆسەی بەکەنیزەککردن تێگەشتنێکی تەواو دورە لەو ئامانج و مەبەستەی کە ئیسلام هەیەتی بۆی لەئیسلامدا ئافرەت بۆیە دەکرێت بەکەنیزەک تا دوای جەنگ ئافرەتە بەجێماوەکان بێ سەرپەرشت نەبن و پیاوێک ببێتە سایە و سێبەریان لەرووی ماددی و مەعنەویەوە پاڵپشتی خۆیان و منالە بەجێماوەکان بێت

## جیاوازی سیستەمی ئیسلام و سیستەمی عەلمانیەت لە چارەسەری ئەو کێشانەی کە دوای جەنگ ڕووبەڕووی کۆمەڵگا دەبنەوە:

ئیسلام بۆ هەمو کێشە کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسیەکان چارەسەرو نایابترین پڕۆژەی هەیە لە ئیسلامدا "ئامانج پاراستنی بەهای مرۆڤە" واتە هەمو شتەکان دەبێت بخرێنە خزمەتی مرۆڤەوە و باشترین چارەسەر دابنرێت بۆ ڕزگاربونی مرۆڤەکان لە هەر کۆسپ و تەنگانەو ناخۆشیەک

بەلام لەعەلمانیەتدا "ئامانج بەدەستهێنانی ئابوری و پارەیە" واتە مرۆڤایەتی دەخرێتە خزمەتی پارەوە کێ هێزو پارەی زیاتر بو ئەوە باشترینە بۆیە کاتێک وڵاتان داگیر دەکەن تاکە شت بەلایانەوە گرینگ بێت چۆنیەتی بردنی سەروەت و سامانی ئەو وڵاتەیە ئیتر

خەڵکەکەی (لەبرسا ئەمرن، ئەکوژرێن، کەم ئەندام بن، مندڵ و ژن بێ سەرپەرشت و هەتیو ئەکەون....هتد)ئەمانە هیچ گرنگ نین بەلای دەسەڵاتدار و سیستەمی عەلمانیەت

لەبەرامبەردا ئەو سیستەمەی ئیسلام دایناوە

## بۆ بارودۆخی دوای جەنگ کاریگەری زۆرباشی هەبوە لەوانە:

1)ئافرەتانی بەجێماو لەشەڕ بێ سەرپەرشت ناکەون و پیاوێک دەبێتە سەرپەرشتیان و کاروباری ڕۆژانەیان لەئەستۆ ئەگرێت بەلام لەسیستەمی عەلمانیەتدا هیچ حسابێک بۆ ئەم ژنانە نەکراوە کە مێردەکانیان لەدەست داوە لەشەڕەکەدا بابەنمونەکی واقعی بەراوردێک بکەین لەنێوان سیستەمی عەلمانی وئیسلامی کاتێک ئەمریکا عێراقی داگیرکرد بەپێی راپۆرتێکی[ڕۆیتەرز]و ڕێکخراوی[IBC] بەهۆی جەنگی ئەمریکاوە بۆسەر عێراق زیاد لە

(1ملیۆن و500هەزار)ئافرەت بێوەژن کەوتبون وە بەپێی ڕاپۆرتێکی[UNICEF]زیاد لە(4ملیۆن)مندال بێ سەرپەرشت کەوتبون

لەعێراق دا ئەمریکا چی کرد بۆ ئەم ژنو مندالانە؟؟!
هیچ بێ سەرپەرشت بەجێی هێشتن حالی ئەم ژنانە لەسالی(2003)وە هەتا ئێستا چی بوە؟؟!

بەشێکیان خۆیان و مندالەکانیان سوال ئەکەن بۆ بەدەستهێنانی قووتی ژیانیان کە ڕۆژانە

سوکایەتیەکی زۆریان پێدەکرێت

کە ئەگەر پێی بلێی وەرە بتکەمە کەنیزەک و

ئەو مافانەت ئەدەمێ(کە پێشتر ئاماژەمان پێدا)نەک هەر ڕازی ئەبێت بەڵکو هەزاران جار سوپاسیشت ئەکات

بەشێکی تری ئەم ژنانە بەداخەوە دەستیان داوەتە لەشفرۆشی بۆ پەیداکردنی بژێویان بەشێکیشیان بە خێرو خێراتی مسوڵمانان ئەژین یاخود مسوڵمانێک کردویەتی بە ژنی دوهەمی کە مولحید و عەلمانیەکان دژی ئەمەشن تاکە هۆکاریش کە دژایەتی فرە ژنی

ئەکەن ئەوەیە کە ئەیانەوێت ژنانی مسوڵمان

بێ سەرپەرشت بکەون پاشان بەئاسانی بکەونە دەستیان هەمو هەوڵی عەلمانیەت بۆ ئافرەت ئەوەیە کە ئەو ئافرەتە دابڕن لە باوک و براو مێردەکەی بەناوی ئازادی و مافی ئافرەت پاشان ئافرەتێکی بێ کەس و بێ سەرپەرشت بە ئاسانی بکەوێتە دەستیان و ئەوانیش چی نەشیاوە لەگەڵی بکەن و بیانکەنە (مۆدێل و ڕێکلامی جلوبەرگ و پێلاو و سابون و عەلاگەو....هتد)

بەڵام ئیسلام درکی بەوە کردوە کە ئەگەر ژنانی کۆمەڵگا(پەروەردەکەری نەوەی داهاتو)

بێ سەرپەرشت بکەون ئەوە کارەسات دروست ئەبێت لە کۆمەڵگادا بۆیە تەنانەت ڕێگەی نەداوە کە ژنانی سوپای دوژمنیش بێ سەرپەرشت بکەون و هەر زوو سپاردویانن بە پیاوێکی مسوڵمان و پیاوەکە بۆتە سەرپەرشتیاری خۆی و منالەکانی

2)عەلمانیەت هیچ حسابێک بۆ فکر و خەڵکانێ ئەو وڵاتە ناکات کە داگر دەکات بەڵکو هەوڵی تەواو دەدات لەڕێگەی ڕاگەیاندنەکانیەوە بەرەو جەهل و نەزانی بەرێت و سەرقاڵیان بکات بەشتی بیسود

وەکو بەچاوی خۆمان ڕۆژانە لە عێراق و کوردستاندا دەبینین ڕاگەیاندنەکان خەڵکیان گەیادۆتە چ ئاستێک و شەو ڕۆژ مەشغوڵیان کردون بە شتی بێ بنەمای وەکو (ڤیستیڤاڵی شاجوان و ڤیستیڤاڵی ڕەنگەکان و جەژنی هالۆوین و شەوە ڕەنگ و لایڤ و میوزیک..هتد) دەیان و سەدان شتی تری بێمانا بەڵام ئیسلام هەوڵی داوە تەنانەت دەستگیر کراوانی سوپای دوژمنیش لەناو کۆمەڵگاکەی خۆیدا بهێڵێتەوە بۆ ئەوەی ببێتە هۆکارێک بۆ هیدایەتدانیان و دەرهێنانیان لە شەوەزەنگی کوفر و گومرایی و بەرەو ڕوناکی

ئیسلام ڕێنمونیان بکاتو لە دونیاو قیامەت سەربەرزیان بکات کە ئەوەش ئامانجی سەرەکی ئەم دینەیە(الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ){ابراهيم 1} واتە: ئەم قورئانە کتێبێکە دامانبەزاندووە بۆت ئەی محمد(ﷺ)تا خەڵکی لە تاریکیەکانی (بێ باوەڕی و نەزانی و سەرلێشێواوی) دەربهێنێت، بەرەو نوورو ڕێبازی ڕۆشنایی ئیمان، بەویستی پەروەردگاریان، تا دەگەنە ڕێبازی ڕاستی خوای باڵادەست و شایستەی سوپاسگوزاری.

بۆیە لەمێژودا زۆرێک لە کەنیزەکەکان مسوڵمان بون کاتێک زانیویانە ئیسلام ئاینێکی پاک و بەسودە بۆ مرۆڤایەتی و پیاوە مسوڵمانەکانیش باش مامەڵەیان لەگەڵ کردون و هەموو مافەکانیان پێداون و بێرێزیان پێ نەکردون گۆڕینی ئاینیش بەویستی خۆیان بووە نەک بەزۆر

3)ئیسلام وایکردوە ئەم کەنیزەک و بەندانە ببنە بەشێک لە کۆمەڵگا و وەچەکانیان بونەتە هاوڵاتی پلە یەک و هەمو مافێکیان هەبوە لەمێژوی مسوڵمانان‌دا

**یەکێک لەدەوڵەتەکان ناوی(دەوڵەتی مەمالیک)بووە واتە دەوڵەتی کۆیلەکان**

**مەمالیک:ناوەکەیان لەوەوە هاتوە کە نەژادیان**

**دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێک بەندەی بەدیل گیراو**

**لەجەنگی مسوڵمانان بەرامبەر بێباوەڕان**

**منداڵ و وەچەکانیان هاوڵاتی پلە یەک بون لە**

**کۆمەڵگادا هێندە خاوەن ماف بون توانیویانە**

**ببنە دەسەڵاتداری مسوڵمانان و زیاتر لە(دوو سەدەو نیو)حوکمی مسر وشام وعێراق و هەندێک بەشی نیمچەدورگەی عەرەبی بکەن لەساڵی(1250تا1517ز) بەڵام عەلمانیەت هەر وڵاتێکی داگیرکردبێ کۆمەڵێک دزو جەردەو مافیا و ئەڵقەلەگوێی خۆی کردوە بە سەرکردەکانیان کە هەر ڕۆژەو جۆرە نەهامەتی و قەیرانێک بەسەر میلەتەکە**

**ئەهێنن ڕۆژ بەڕۆژ ژیانی خەڵک قورستر ئەکەن و زیاتر وڵاتەکە بەقوڕدا دەبەن بۆ ئەوەی هەرگیز خەڵکی ئەو وڵاتە نەتوانێت پێیان بڵێت ئێوە داگیرکەرن و سەروەتو سامانی وڵاتان دزیوین و بچنە دەرەوە لەژیانمان ئێوە ئێمەتان کردوە بە کۆیلەی پێش ئیسلام و**

**هیچ مافێکی سەرەتاییمان پێ ڕەوا نابینن کۆیلەکانی سەردەمی ئیسلام زۆر لە خەڵکە**

**(بەحساب)ئازادەکەی وڵاتانی داگیرکراوی ئەمریکای ئێستا و بەریتانیاو فڕەنسا و ئیتالْیای جاران خۆشتر**

**ژیاون و مافەکانیان زیاتر دابین کردوە مێژو پڕ پڕە لەوێنەو چیرۆکی قێزەونی دەسەڵاتدارانی عەڵمانی بەرامبەر وڵاتانی مسوڵمانانی داگیرکراو**

**(لەبەر درێژنەبونەوەی بابەتەکە نامانەوێت ئاماژەی پێبدەین) خۆیان خەڵکیان کردوە بەکۆیڵە لەم سەدەی21یەکەدا بەڵام لەڕێی ڕاگەیاندنەکانیانەوە و لەڕێی بەچکە موڵحیدە بەزیو نەزۆکەکانیانەوە داکۆکی لەمافی کۆیلەکانی چواردەسەدە پیش ئێستای ژێر دەسەڵاتی مسوڵمانان دەکەن و فڕمێسکی تیمساحیان بۆ دەڕێژن**

**4)ئیسلام نەک هەر سوکایەتی بەژێر دەستەکان نەکردوە بەڵکو بەگەورە باسی کردون و پاداشتەکەی بەدوو بەرامبەر بۆ حیساب کردون ئەگەر بێتو مسوڵمان بن ئەوە دوو پاداشتیان بۆ هەیە:**

**یەکەم:پاداشتی گوێرایەلی خودا**

دووەم:پاداشتی گوێرایەڵی خاوەنەکانیان

ئەم تێروانینەی ئیسلام بۆ بەندەکان وایکردوە
لە سەحابەیەکی بەڕێزی وەکو[ابوهريره]کە
بڵێت:(للعبد الملوک أجران والذي نفسي بيده
لولا الجهاد والحج وبر أمي لأحببت أن أموت و أنا
مملوک){رواه البخاری 2548 ومسلم1665}
واتە:بەندەکان دوو پاداشت وەردەگرن سوێند بەو
زاتەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر لەبەر جیهاد و حەج و
مافی دایکم نەبوایە ئەوە حەزم ئەکرد بە بەندەیی بمرم

پێغەمبەر(ﷺ)لە چەندین فەرمودەدا ئامۆژگاری
شوێنکەوتوانی کردوە کە زۆرباش بن لەگەڵ کەنیزەک
و ژێردەستەکانیان دا لەفەرمودەیەکدا
پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموێت:(أيما رەجل كانت عنده وليدة
فعلمها فأحسن تعليمها وأدبارها ثم أعنتقها وتزوجها فله
أجران){رواه البخاری5083}

واتە:هەر پیاوێک کەنیرەکێکی لابو بەجوانی

فێری کرد وە بەجوانی پەروەردەی کرد و فێری ئادابە
جوانەکانی کرد پاشان ئازادی بکات و پاشانیش

**بیخوازێت(بە عەقدی زەواج بیکاتە ژنی هەمیشەیی خۆی) دوجار پاداشت ئەدرێتەوە(پاداشتی**

**پەروەردەیەکی جوان و پاداشتی ئازادکردن و هێنانی)**

**ئا ئەمە ئامانجی ئیسلام بوە لەم بابەتەدا ڕزگارکردنی ئافرەتێکی بێکەس سەرپەرشتی کردنی پەروەردەو فێرکردنی ئاداب و ئەخلاقی جوان پاشان ئازادکردنی پاشانیش زەواجکردنێکی هەمیشەیی**

**ئیستاش کاکی مولحید هاتوە بە عەقلێکی بۆش و ناخێکی بۆگەن و هزرێکی لەرزۆکەوە خۆی کردوە بە داکۆکیکاری مافی کۆیلەکانی 14سەدە پێش ئێستا و چاوی داخستوە لە ئاست ئەو هەمو داگیرکاریەی کۆمەڵایەتی و وەحشیگەریانەی ڕۆژانەبەبەرچاویەوە ڕوودەدات لەسەر دەستی دەسەڵاتدارانی عەلمانی و شوعی و لادینیەکانی هاوبیریەوە**

## کۆتایی

***سیستەمی بەکەنیزەککردن لە ئیسلامدا(بەو مەرج وئەحکامانەی ئیسلام دایناوە)باشترین پلانێکە کە دوای**

**جەنگ پەیڕەو بکرێت بۆ چارەسەری ئەو دۆخە قورسەی دوای جەنگ دروست دەبێت**

***بە کەنیزەک کردن بۆ لەئەستۆ گرتنی ژنان و منداڵانی بەجێماوی دوای جەنگە نەک ئێهمالکردنیان**

***بە کەنیزەک کردن بۆ پاراستنی کۆمەڵگایە لە**

**بڵاوبونەوەی فەساد و خراپەکاری و بێ ڕەوشتی و داوێن پیسی**

***هەمیشە شانازی بە ئیسلامەکەمانەوە دەکەین و خۆمان لە هیچ یاساو شەریعەتێکی**

**نادزینەوە و لەهەموو سەردەمێکدا بەباشترین**

**و چاکترین بەرنامەی دەزانین بۆ چارەسەری**

**کێشە کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسیەکانی وڵات**

***ئەمەی لەم نوسینەدا باسکرا ئەحکامەکانی**

**کەنیزەک و چۆنیەتی هەڵسوکەوت بوو لەگەڵیان بەپێی ئەو شەریعەتەی کە لە قورئان و فەرمودەکان دا هاتوە لە غەیری ئەمە هەر خیلافەت و گوپ و ڕێکخراوێکی ئیسلامی کۆن و نوێدا بەشێوازێکیتر مامەڵەی کردبێت لەگەڵ کەنیزەک دا ئەوە ماڵ نیە بەسەر ئیسلامەوە و ئیسلام لێی بەریە**

*بە مولحید و عەلمانیەکانیش ئەڵێین:دەزانین
کە ئێوە کەسایەتیەکی شەهوەتبازن هەر بابەتێکتان بۆ باسدەکرێت ڕاستەوخۆ تەنها لایەنە سێکسیەکەی دەبینن و ناتوانن و ئامادەنین بەهیچ چاوێکی تر سەیری بابەتی(ژن)بکەن بەڵام وەکو باسمان کرد ئامانج لە بەکەنیزەک کردن زۆر گەورەتر و فراوانترە لەوەی ئێوە بیری لێدەکەنەوە ئامانج لێی لە (ئەستۆگرتنە ،هیدایەتدانە ،پاراستنە) ژیانە لە ژینگەیەکی ئارام دا و پەروەردەکردنی نەوەیەکی نوێ و ئازادە

*تەحەدای هەمو مولحیدان دەکەین لە ئێستاوە تا قیامەت بتوانن چارەسەرێکی باشتر و گونجاو تر بهێنن بۆ بارودۆخی ئەو ژن و منداڵانەی کەلە دوای جەنگ دروست دەبێت چارەسەرێک بێت بە کرداری جێبەجێ کرابێت و لێکەوتەی باشی هەبێت لەوەی کە چارەسەرەکەی ئیسلام هەیبووە نەک تەنها قسەی سەر وەرەقەو قسەی زانایانی بەناو فەلسەفەو بیردۆز و باقو بریق بێت

